علی خان

# تۆپی پێ

## لە دیدێکی شەرعی و واقعیەوە

چاپی یەکەم
١٤٣١

لەبڵاوکراوەکانی

**ماڵپەڕی بەهەشت**

**www.ba8.org**

islam_kurd_ba8@yahoo.com

07701517378

**عێراق - کوردستان - کەلار**

**هەمیشە لەگەڵمان بن بۆ بەرهەمی نوێ**

**کتێبی ژمارە ( ١١١ )**

بسم الله الرحمن الرحيم

سوپاس و ستایش بۆ خوای میهرەبان، پەروەردگاری جیهانیان، سڵاو درود لەسەر پەیامبەری پێشەوامان، مامۆستامان، هەروەها لەسەر خانەوادە و هاوەڵان، هەروەها شوێنکەوتوان بە چاك تا ڕۆژی پەسڵان.

خوێنەری بەڕێز...

دوای ئەوەی تێبینی دەکرێ مومارەسەکردنی تۆپی پێ بووە بە دیاردە لە واقیعدا، جەماوەرێکی ئێجگار زۆری لە دەوری خۆی کۆ کردۆتەوە، بە تایبەت لەم دواییانە دەیان بەڵکو سەدان ناشەرعی تێکەوتوە.

خۆ لێ ڕاکردنیشی ڕاکردنە لە واقیع، خراپترین واربێژیش ئەوەیە باسەکانی لە شوێنێك بن و واقیعی گەلەکەشی لە شوێنێکی تر، هەر بۆیە بە پێویستم زانی لەو بارەیەوە ڕونکردنەوەیك بدەم.

بەڵام لە ئەنجامدانی ئەم کارە دوو دڵ بووم چونکە ئەوەندەی ئاگادارم لەوەو پێش کەسم نەدیبوو لەوبارەیەوە ڕونکردنەوەیەکی شەرعی بدات، نە بە وتار نە موحازەرە.. -هەڵبەت ئەوەندەی من ئاگادار بم- هەر بۆیە سەرەتا ئیستیخارەم کرد و پاشان ئیستیشارەم بە جەنابی مامۆستا عەبدوللەتیف ومامۆستا خەلیل ئەحمەد ومامۆستا عەدنان بارام کرد.. کە بینیم پێیان باشە ودەخوازێ لە دیدێکی شەرعیانەی میانڕەویانەوە باسی لێوە بکرێ و هەقیقەتەکەی ڕوون بکرێتەوە.

بۆیە الحمد لله دڵم ئۆقرەی گرت و لەسەر بەرەکەتی خوای میهرەبان وتاری ڕۆژی هەینیمان لە بەرواری ٢٨جمادی دووەمی ١٤٣١ بەرانبەر ٢٠١٠/٦/١١ تایبەتکرد بەو باسەوە.

جا ئەم نامیلکەیەی بەردەستت پوختەی ئەو وتارەیە و برای بەڕێزم کاك ڕەزا صلاح الدین بەتاڵی کردۆتە سەر کاغەز و پاشان بە کۆمپیوتەر نوسیویەتیەوە -خوای مەزن پاداشتی خێری بداتەوە-؛ پاشان هەستامەوە بە پێداچونەوەیی و ڕێککردنەوەی، هەندێکم بۆ زیادکرد و هەندێکی کەمیشم لێ لادا...

جا ئەگەر هەر هەق و ڕاستیەکی تێدا بوو ئەوە تەنها و تەنها لە خوای مەزنەوەیە، هەرچی غەیرە ئەوەشی تێدا بوو ئەوە لە نەفسی بەدکاری خۆم و شەیتانەوەیە، خوای پایەرز و پەیامبەرە ئازیزەکەی لێی بەرین. وصل اللهم على محمد وآله والحمد لله رب العالمين.

* * * *

# تۆپی پێ

إنَّ الحَمْدَ للهِ، نَحْمَدُهُ وَنَسْتَعِيْنُهُ وَنَسْتَغْفِرُهُ، وَنَعُوْذُ باللهِ من شُرُوْرِ أَنْفُسِنَا، وَمنْ سَيِّئَاتِ أَعْمَالِنَا، مَنْ يَهْدِهِ اللهُ فَلا مُضِلَّ لَـهُ، وَمَنْ يُضْلِلْ فَلا هَادِيَ لَهُ، وَأَشْهَدُ أَنْ لا إِلَهَ إِلاَّ اللهُ وَحْدَهُ لا شَرِيْكَ لَهُ، وَأَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّداً عَبْدُهُ وَرَسُوْلُهُ.

﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱتَّقُواْ ٱللَّهَ حَقَّ تُقَاتِهِۦ وَلَا تَمُوتُنَّ إِلَّا وَأَنتُم مُّسۡلِمُونَ ﴾

﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ ٱتَّقُواْ رَبَّكُمُ ٱلَّذِي خَلَقَكُم مِّن نَّفۡسٖ وَٰحِدَةٖ وَخَلَقَ مِنۡهَا زَوۡجَهَا وَبَثَّ مِنۡهُمَا رِجَالٗا كَثِيرٗا وَنِسَآءٗۚ وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ ٱلَّذِي تَسَآءَلُونَ بِهِۦ وَٱلۡأَرۡحَامَۚ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ عَلَيۡكُمۡ رَقِيبٗا ﴾

﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱتَّقُواْ ٱللَّهَ وَقُولُواْ قَوۡلٗا سَدِيدٗا ٧٠ يُصۡلِحۡ لَكُمۡ أَعۡمَٰلَكُمۡ وَيَغۡفِرۡ لَكُمۡ ذُنُوبَكُمۡۗ وَمَن يُطِعِ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ فَقَدۡ فَازَ فَوۡزًا عَظِيمًا ﴾

أَمَّا بَعْدُ : فَإِنَّ أَصْدَقَ الحَدِيْثِ كِتَابُ اللهِ وَخَيْرَ الهَدْيِ هَدْيُ مُحَمَّدٍ ﷺ وَشَرَّ الأُمُوْرِ مُحْدَثَاتُهَا وَكُلَّ مُحْدَثَةٍ بِدْعَةٌ وَكُلَّ بِدْعَةٍ ضَلالَةٌ وَكُلَّ ضَلالَةٍ فِي النَّارِ.

موسڵمانە بەڕێزەکان بەخێرهاتنی هەموو لایەکتان دەکەم، داواکارم لە خوای مەزن چۆن لەسەر تاعەت و عیبادەتی خۆی لە ماڵەکەی خۆیدا کۆی کردوینەتەوە، هەربەو جۆرە لە بەهەشتە پان و بەرین و فراوانەکەی خۆیدا، لەگەڵ سەرداری مرۆڤایەتیدا پێغەمبەر -صلی الله علیە والە وسلم- کۆمان بکاتەوە.

خۆشەویستەکان مەوعیدە ئەمڕۆش لە خزمەتاندا باسی کارێکی تر بکەین لە زنجیرە باسی: کارەکان دڵ.

بەلاَم لەبەرئەوەی ئەمڕۆ «کأس العالم» دەست پێدەکات، کە بووە بە نەخۆشییەك زۆرێك پێوەی گیرۆدەبوون، بە پشتیوانی و تەوفیق و عەونەتی خوای تعالی ووتاری ئەمڕۆمان تایبەتە بە باسی «کأس العالم» و تۆپی پێوە.

## دەستپێك

هەڵبەت سەرەتا ئەوە بزانن خۆشەویستەکان من نە دژی وەرزشم، نە دژی وەرزشوانانم، لەوەئەچێ خۆشمان هەندێ جار و هەندێك جۆری وەرزش مومارەسە بکەین.

جا باسەکەم بۆ هەدمکردنی وەرزش و وەرزشوانان نییە، نەخێر! بەڵکو ئامۆژگارییەکە، ئاگادارییەکە بۆ برایانی خۆمان لە گەنجەکان و لاوان و ئەوانەی کە مومارەسەی دەکەن یان موتابەعەی دەکەن.

من ناڵێم تۆپێن حەرامە، ناڵێم تەماشاکردنی یاری حەرامە، بەلاَم ئەشبێت ئەوەمان لەبیر نەچێت کە کۆمەڵێك زەرەر و زیانی لێکەوتۆتەوە، کۆمەڵێك حەرامی تێوەگلاوە.

جا هەربۆیە ئەمڕۆ بە پشتیوانی و تەوفیق و عەونەتی خوای مەزن پوختەی وتارەکەمان بریتییە لە زەرەر و زیانەکانی تۆپی پێ.

# تێڕوانینی ئیسلام بۆ وەرزش

پێش ئەوەی بڕۆمە سەر باسی زیانەكانی تۆپی پێ، پێم خۆشـە كورتەیـەك سـەبارەت بـە تێڕوانینـی ئیـسلام بـۆ وەرزش بە گشتی چی یە؟

خۆشەویستەكان..

لە ئیسلامدا وەرزشكردنێك كە بۆ لاشەی مرۆڤ باش بێت و گەش و نمای پێ بدات، ئامادەی بكات بۆ تێكۆشـان لە پێناوی خوا -سبحانە وتعالى- ئەوە كارێكی باشە وبەڵكو هانیشی لەسەر دراوە كە ئەنجام بدرێت.

لەو فەرموودە و ئایەتانەی كە لەو بارەیەوە هاتون هەندێكی عەرزی خزمەتان دەكەم:

* لە سونەنی ئەبوداود و موسنەدی ئیمامی أحمد دا بە سەنەدێكی صەحیح هاتووە لە حەدیـسەكەی عائیـشە -ڕەزای خوای لێبێت- ئەفەرموێ: جارێكیان بەڕێوە بووین بەرەو جیهاد ئەڕۆیشتین، پێغەمبەری خوا -صلى الله علیـه والە وسلم- بە هاوەڵانی فەرموو: ئێوە پێشكەون، سەحابییەكانیش پێشكەوتن.

پێی وتم: عائیشە با پێشبڕكێ بكەین، ئەڵێ: پێشبڕكێمان كرد لە پێغەمبەری خوام بردەوە -علیه الصلاة والسلام-.

تەماشای ئەو پیاوە مەزنە بكەن، تەماشای پێشەوا و ڕابەر و مامۆستاكەمان بكەن، ئاوهایە لەگەڵ حێزانەكـەی خۆیدا، توخخوا كامان لە ڕوومان دێت بەو جۆرە لەگەڵ خێزانی خۆماندا هەڵسوكەوت بكەین.

ئەڵێ: دوای موددەتێك، دوای چەندساڵێك، دوای ئەوەی ئەو پێشبڕكێیەم لە بیرچوەوە و گۆشـتم گـرت و لـەڕی و لاوازییەكـەم نـەما، پێغەمبـەری خـوا -علیـه الـصلاة والـسلام-، دیـسان بـە هـاوەڵانی ووت: ئێـوە پێـشكەون، ئـەڵێ: پێشبڕكێی لەگەڵدا كردم، بەڵام ئەمجارە ئەو لێی بردمەوە، ئەوەبوو پێكەنی و فەرمووی: ئەمە بەرامبەر بەئەوە. یانی: جارێكیان تۆ برتەوە و ئەمجارەش من بردمەوە، ئێستا هەردووكمان بەرامبەرین.

كەواتـە مەسـەلەی وەرزش كـردن و پێـشبڕكێ كـردن لـە شـەریعەتی ئیـسلامدا نـەهی لەسـەر نـەهاتووە، بـەڵكو پەیامبەری خوا -صلى الله علیه والە وسلم- ئەوەتا خۆی پێشبڕكێی وەرزشی كردوە.

* هەروەها پێغەمبەری خوا -صلى الله علیه والە وسلم- ئەفەرموێ: «لاَ سَبْقَ إِلاَّ فِى خُفٍّ أَوْ نَصْلٍ أَوْ حَـافِرٍ» واتـە: نابێت پارە و عیوەز وەربگیرێت لە هیچ موسابەقە وپێـشبڕكێیەكدا، جگـە لـە یـاری وشترسـواری و ئەسـپ سـواری و تیرهاویشتن. زانایانیش هەر شتێكی تر وەكو ئەوانە بێت قیاسـی دەكەنـە سـەری، وەكـو ئۆتۆمبێـل و چـەند شـتێكی تریش.

كەواتە دیسانەوە وەرزشكردن و یاریكردنێك كە سود و قازانج و مەنفەعەتێكی هەبێت لـە شـەریعەتی ئیـسلامدا ڕێگری لێنەكراوە، بەڵكو هانیشی لەسەردراوە.

تەنانەت ڕێگەشی داوە پارەی لەسەر وەربگری، ئەمەش هەموی بەڵگەی ڕوونن کەوا ئیسلام هانی وەرزش دەدات ئەگەر چاك بێت، کە سودی هەبێت بۆ تاك و بۆ کۆمەڵگاکان.

* هەروەها جارێکیان ڕەسولی خوا -صلى الله عليه واله وسلم- زۆران لەگەڵ «ڕوکانەدا» دەگرێت -کە سەحابییەکە-، لە ئەنجامدا ڕەسولی خوا ئەیدا بە زەویدا و لێیدەباتەوە.

ئەڵێ: قوربان ماوەیەکی تر دووبارەی دەکەینەوە، کە دووبارەی دەکەنەوە، دیسانەوە ڕەسولی خوا لێیدەباتەوە، سێبارەی دەکەنەوە بۆ جاری سێیەمیش هەر پەیامبەری خوا-صلى الله عليه واله وسلم- لێی دەباتەوە...

کەواتە وەرزش کردن لە شەریعەدا نەهی لەسەر نەهاتووە، ئیشکالی تیادا نییە، ئەوەتا ڕەسولی خوا -صلى الله عليه واله وسلم- خۆی یاری لەگەڵ ئەو هاوەڵەدا دەکات، یاریەك کە بە سودە...

## کەواتە بۆ باسی تۆپێنکردن

خۆشەویستەکان..

گەر ئاوها بێت ئیشکالی تیادا نییە، ئیشکالەکە لەوەدایە کە تۆی موسڵمان یاریزانەکەت لە باوك و دایکت و تەنانەت لەو ئیسلامە عەزیزەش خۆشتر بوێت، ئیشکالەکە لەوەدایە ئەگەر تیپی فلاَن و تیپی ئیسلام یاری بکەن بڵێی پێم خۆشە ئیسلامەکە بدۆڕێ و تیپی فلاَن بیباتەوە -وەك لە هەندێکەوە پێمان گەیشتوە-، ئیشکالەکە لەوەدایە بیکەیت بە قوربانی دایك و باوکی خۆت، ئیشکالەکە لەوەدایە جومعە و جەماعەتەکەت بفەوتێنیت لەبەر خاتری تۆپێن.

## مەبەست لەوەرزشکردن لە ئیسلامدا

پاشان خۆشەویستەکان..

هەر یارییەك کە هانی لەسەر درابێت لە ئیسلامدا سودی ئەشکێتەوە بەسەر ئەوانەی مومارەسەی دەکەن و بەسەر ئەو خەڵکەشی تەماشایان دەکات.

بۆ نمونە: زۆران گرتن سودی هەیە بۆ لاشەی مرۆڤ، و ڕاکردن سودی هەیە بۆ لاشەی مرۆڤ ..هتد.

بەڵام تۆپێن خەڵکێکی زۆر تەماشای دەکات و خەڵکێکی کەم یاری دەکات. خەڵکێکی کەم ئیستیفادە ئەکات لە تۆپێن کە ئەوانیش تەنها یاریزانەکانن. ئیتر ئەو ئیستیفادە ماددی بێت یان مەعنەوی، ئەوەبێت کەلاشەیان تەقویە دەبێت یان ئەو قازانجە ماددیە زەبەلاحانە بێت کە لەسەر شاشەی تەلەفزیۆنەکانەوە دەیبینین، ئیشکالەکە ئا لێرەدایە خۆشەویستەکان.

## مێژووی تۆپی پێ

هەڵبەت تۆپی پێ مێژووییەکی دوور و درێژی هەیە، زۆرێك دەیگێڕنەوە بۆ سەردەمی «صینی»یەکان کە لە زۆر کۆندا ئەنجامیان داوە، کە دەگەڕێتەوە بۆ «٣٠٠ - ٥٠٠» پ.ز ، پێش لەدایك بوونی عیسا -علیه السلام- کە ئەکاتە نزیکەی «٢٣٠٠-٢٥٠٠» ساڵ پێش ئێستا، بەڵام بە پێی مێژوو و ئەدوارەکان گۆڕاوە، یاسای نوێی بۆ دارێژراوە.

لەم دواییانە لە ئینگلیزدا زۆر بایەخی پێدرا، ئیتر تا وای لێهات هەموو وولاتانی ئەوروپای گرتەوە، بەڵام لە هەمووی زیاتر ئینگلیز.

## توندوتیژی بە درێژایی مێژوو لە تۆپێن دانەبڕاوە

هەر لەو ڕۆژەوەی تۆپێن دروست بووە توندو تیژی و خشونەتی هەر پێوە بووە تا ئەمڕۆ، هەتا وای کردووە هەندێك لە پاشاکانی ئەوروپا کاتی خۆی تۆپێنیان قەدەغە کردووە، لەوانەی کە من بەرچاوم کەوتوون:

- مەلیك ئیدواردی دووەم لە ساڵی ٧١٤

ئەم پادشایە تۆپێن قەدەغە دەکات و دەڵێ: نابێت تۆپێن ئەنجام بدرێت، چونکە شەڕ و ئاژاوە و دووبەرەکی زۆری لێدەکەوێتەوە.

- هەروەها مەلیك ئیدواردی سێ یەم ساڵی ٧٦٦.
- هینری چوارەم.
- هینری حەوتەم.
- ڕیچاردی دووەم.
- مەلیك ئیلزابێس.

هەموویان تۆپێنیان قەدەغە کردووە لەسەردەمی خۆیاندا، چونکە بینیویانە ئەوەندە خراپە و چەپەڵی لێدەوەکەوێتەوە، ئەمانەش هەمویان ئەوروپین، هەموویان پاشای وولاتانی ئەوروپا بوون لەسەردەمی خۆیاندا.

## تۆپێن شەعبیەتی خۆی هەر لە دەست نەداوە

بەڵام تۆپێن سەرباری ئەوەی هەر بە توند و تیژی هاتووە، بەڵام تاوەکو ئەمڕۆ جەماوەرەکەی خۆی لە دەست نەداوە، تاوەکو ئەمڕۆ زۆرترین جەماوەر و بینەر و هاندەری هەیە، زۆرترین تەماشاکەری هەیە لە لایەن سەرجەمی خەڵکەوە لە نێو دەیان یاری تری وەرزشیدا، هەروەها لەلایەن سەرجەم چین و توێژەکانەوە، هەر لە سەرۆکی وولاتەکانەوە تاوەکو کرێکارێك و خەڵکێکی ئاسایی موتابەعە دەکرێت.

# زەرەر و زیانەکانی تۆپی پێ

لەو زەرەر و زیانانەی تۆپی پێ هەر بە خێرایی:

<u>زیانی یەکەم</u>: زایەبوونی عەقیدەی «ولاء و بەراء» «دۆستایەتیکردن و خۆبەریکردن».

کە خاڵێکی زۆر سەختە، زۆرێك لە موسڵمانان لەوانەی کە عاشقی تۆپی پێن.

کە ئەڵێم عاشقی تۆپی پێ بە ڕاستی ئەسەف ئەکێشم، لاریمان نیە سەیری تۆپێن بکرێ، خۆیشت تۆپێن بکەیت، بەلاّم بە «زەوابت و رەوابت»ی شەرعییەوە نەك ببیت بە عاشقی تۆپ، ببیت بە عاشقێك کە نان و ئاوت ببێت بە تۆپێن و یاریزانەکان.

یەکەم زەرەر و زیان خۆشویستنی ئەو یاریزانانەیە، کە زۆرێکیان کافر و بێ دینن.

پێغەمبەری خوا -صلى الله عليه وآله وسلم- ئەفەرموووێ: «الْمَرْءُ مَعَ مَنْ أَحَبّ»، گەنجەکان باش ئەو فەرموودە وەربگرن، ئەفەرموێ: «مرۆڤ لە قیامەت دا لەگەڵ ئەوکەسەدا حەشر ئەکرێ کە خۆشی دەوێ».

کامتان ڕازین لەگەڵ مارادۆنا و ڕۆناڵدۆ دا حەشر بکرێ؟! کامتان پێتان خۆشە؟!

موسڵمانی بەڕێز..

موتابەعەی بکە، حەز لە یارییەکەی بکە کە جوان یاری ئەکات، بەلاّم:

بۆ حەز لە خۆی دەکەیت و خۆشیت دەوێت؟!

بۆ شەڕ لەگەڵ براکەتدا دەکەیت لەسەری؟!

بۆ باوکت ئەڕەنجێنی لەسەری؟!

بۆ کاتێك کە توشی پێکانێك ئەبێت سێ ڕۆژ نان ناخۆیت؟! کە هەر لەم شارەدا ڕوویداوە.

بۆ لەماڵ دەردەچی سێ ڕۆژ نایەیتەوە؟!

بۆ تەلاّقی ژنەکەت ئەدەیت لەبەرخاتری تۆپێن؟!

موصیبەتەکە زۆر گەورەیە خۆشەویستەکان.

دکتۆری وا دەناسین ژنی خۆی تەلاّق داوە لەسەر تۆپێن!

خوێندکار دەناسم تاقی کردنەوەکەی دواخستووە لەبەر خاتری تۆپێن!

داهاتووی خۆی ئەفەوتێنێ لەبەرخاتری ٩٠ خولەك؟!!

بۆ خۆشەویستەکان بۆ؟

نایەت بۆ نوێژی جەماعەت لەبەرخاتری ئەوەی یاریە؟!

چونکە شەوتێکی لەدەست دەردەچێ، بەس نوێژەکەی لەدەست دەرچێ قەیدی نییە!!؟؟

بۆ ئەی ئومەتی موحەممەد وامان لێهاتووە؟! بۆ ئەوەندە غافلین لە خۆمان؟!

بۆ ئەبێ وەسیلەکان بکەینە ئامانج و غایەت و ئیشی بۆ بکەین؟!

کە تۆپێن وەسیلەیەکە بۆ وەرزشی لاشە و بەدەنی مرۆڤ، بۆ ئەوەی لاشە هەندێك چست و چالاك بێت لە هەڵسوکەوتدا، نەوەك شەڕی لەسەر بکەیت و کوشتاری لەسەر بدەیت -هەروەك باسی لێوە دەکەم بە ئیزنی رب العالمین-.

نابێت موسڵمان هیچ کەسێکی بێ باوەڕی خۆش بوێت ئیتر یاریزان بێت وەزیر بێت گزیر بێت، نابێت بە هیچی شێوەیەك...

خوای گەورە ئەفەرموێ: ﴿لَا يَتَّخِذِ الْمُؤْمِنُونَ الْكَافِرِينَ أَوْلِيَاءَ مِنْ دُونِ الْمُؤْمِنِينَ وَمَنْ يَفْعَلْ ذَلِكَ فَلَيْسَ مِنَ اللهِ فِي شَيْءٍ إِلَّا أَنْ تَتَّقُوا مِنْهُمْ تُقَاةً وَيُحَذِّرُكُمُ اللهُ نَفْسَهُ وَإِلَى اللهِ الْمَصِيرُ﴾

ئەفەرموێ: «هیچ کاتێك ئیماندار کافر ناکات بە دۆست و وەلی و یار و یاوەری خۆی، نایکات بە پشتیوانی خۆی، خۆشی لێنایەت.

هەرکەسیش ئەوە بکات -یانی: بیکات بە دۆست و وەلی و یار و یاوەر و پشتیوانی خۆی، وخۆشی لێبێت- ئەوا: ﴿فَلَيْسَ مِنَ اللهِ فِي شَيْءٍ﴾ تەبەری ئەفەرموێ[1]: یانی ئەو کەسە لە خوا بەرییە و خواش لەو بەرییە، چونکە هەڵگەڕاوەتەوە لە دین».

عەزیزەکان زیناکردن و مەشروب خواردن ئەوەندەی خۆشویستنی کافر لای خوا گەورە نیە!! خۆشویستنی کوفر و ئیلحاد زۆر مەترسیدارە.

پاشان خوای گەورە ئاگاداری موسڵمانان دەکاتەوە بە نەفسی خۆی و ئەفەرموێ: ﴿وَيُحَذِّرُكُمُ اللهُ نَفْسَهُ وَإِلَى اللهِ الْمَصِيرُ﴾ خوای مەزن وریاتان دەکاتەوە لە نەفسی خۆی و بزانن گەڕانەوەشتان هەر بۆلای ئەوە، هەریۆبە خۆتان ئامادە بکەن بۆ ئەو ڕۆژە و وەڵامی پرسیارەکان ئامادە بکەن.

کە ئەگەر خوای گەورە تەوفیقمان بدات لە داهاتوودا چەند ووتارێك تایبەت دەکەین بە باسی «ولاء وبراء»ـەوە.

---

[1] دەقەکەی: ومعنى ذلك: لا تتخذوا، أيها المؤمنون، الكفارَ ظهرًا وأنصارًا توالونهم على دينهم، وتظاهرونهم على المسلمين من دون المؤمنين، وتدلُّونهم على عوراتهم، فإنه مَنْ يفعل ذلك "فليس من الله في شيء"، يعني بذلك: فقد برئ من الله وبرئ الله منه، بارتداده عن دينه ودخوله في الكفر.

هەربۆیە وریابن عەزیزەکان، ﴿وَمَنْ يَتَوَلَّهُمْ مِنْكُمْ فَإِنَّهُ مِنْهُمْ﴾ واتە: هەرکەس لە ئێوە دۆستایەتیان بکات ئەوە لەوانە و لەئەوان دەژمێردرێ.

عەرزم کردی.. حەز لە یاری ئەکەی؟ بکە، سود لە شێوازی یاری کردنەکەی وەربگرە، بەس بۆ ئەوەندە خۆشت ئەویٚ کە لە باوك و دایکت زیاتر؟! بەخوا زۆر لەوە زیاترە کە من باسی ئەکەم، خۆزگە پێش ئەوەی ئەهاتمە سەر مینبەر هەندێك لەو گەنجانەم ئەهێنایە قسە، بۆ ئەوەی باسی واقیعی خۆیان بکردایە، هەرکەسێك باسی برادەر ودەور وبەرەکەی خۆی بکردایە، بە ڕاستی سەیر و سەمەرەتان گوێ لێدەبوو.

ئەمە مشتێکە لە خەرمانێ کە عەرزی خزمەتتانی ئەکەم.

زیانی دووەم: تۆپێن بووە بە مایەی ئاشوب، وئاژاوە، وناکۆکی، ودووبەرەکی، وڕقەبەرایەتی، وشەڕ کردن، وجوێن دان، وقسەی ناشرین بە یەکتری کردن.

لە کاتێکدا خۆشەویستمان - صلى الله عليه وآله وسلم- ئەفەرموێ: «سِبَابُ الْمُسْلِمِ فُسُوقٌ وَقِتَالُهُ كُفْرٌ» وەکو لە بوخاریدا هاتوە لە حدیسەکەی ئیبن مەسعود.

واتە: جوێن دان بە موسڵمان لە تاعەتی خوا دەرچوونە فیسقە، و کوشتار لەگەڵ کردنی کوفرە.

چەند موسڵمان یەکتریان کوشتووە لەبەرخاتری تۆپێن، چەندجار لە ڕۆژنامەکان خوێندوتانەوە کە لە چایخانەکاندا کردویانەتە کلاشینکۆفدا لە یەکتری لەبەرخاتری تۆپێن، لەبەرخاتری یاریزان.

کە ئەوەندە لە خۆیان ڕانابینن بێن و سەردانێکی جەماوەرەکانی خۆیان بکەن.

کاتێکیش کە سەردانێك دەکات لە بەرامبەردا بە ملیۆنەها دۆلار وەردەگرێ تەنها لەبەر سەردانێك.

ئەو بۆ دۆستی تۆ نی یە؟!

بۆچی نایەت سەردانێکی تۆ بکات؟! لە کاتێکدا تۆ خۆتی لەسەر ئەدەیتە کووشت!

هەربۆیە خۆشەویستەکان ئەبێ وریا بین، نابێ بهێڵین ئەو هەموو خراپە لە دەرئەنجامی تۆپێنکردن و تەماشاکردنی تۆپێندا بکەوێتەوە.

جا ئەی خۆشەویست..

تەماشای تۆپێن بکە، تۆپێنی خۆت بکە، بەلاّم بە زەوابتی شەرعی، لە سنوری ئیسلامدا، لە سنوری شەریعەتدا، بە تایبەت گەنجەکانمان ئەبێ زۆر وریای ئەم بابەتەبن، ئەگەر چی من پێموایە تۆپێن وەکو تۆم و جێریەکەی لێهاتووە، گەورە و بچوك و ژن و پیاو هەمووی تەماشای تۆپێن ئەکات.

کە یەکێکی تر لە مەفسدەکانی تۆپێن ئەوەیە:

زیانی سێیەم: تەماشاکردنی تۆپی پێیە لەلایەن ئافرەتانەوە.

لە یاری تۆپێندا مەعلومە ڕانی یاریزانەکە دەردەکەوێت، بەڵکو هەندێکجار لە ڕانی بۆ سەرووەش دەردەکەوێت — وەك زۆرجار لە شاشەکانەوە دەبینرێت-.

کەواتە مادام ڕانی یاریزانە پیاوەکان دەردەکەوێت، تەماشاکردنی تۆپێن بۆ ئافرەتان قەدەغەکراوە، ئەمە جگە لەوەی تەماشاکردنی یاریزانەکان لەلایەن ئافرەتانەوە خۆی بۆخۆی حەرامێکی ترە. باسی ئەوە هەر ناکەین کە هەندێکجار یاریزانەکە وەك ئەوەی ڕووت بێت و هیچی لەبەر نەبێت وایە.

جا ئەو فەرمودانەی کە لەبارەی ناشەرعیەتی دەرکەوتنی ڕانەوە هاتون زۆرن، هەموی بە ڕاشکاوی پێمان دەڵێن کەوا ڕانی مرۆڤ عەورەتە.

لەوانەش: فەرمووده‌کەی عەلی، فەرموودەکەی جەرهەدی ئەسلەمی، فەرموودەی چەند سەحابی تر.

بە جەرهەدی ئەسلەمی ئەفەرموێ: «غَطِّ فَخْذَكَ ، فَإِنَّ الْفَخْذَ عَوْرَةٌ» ڕانت داپۆشە چونکە ڕان عەورەتە.

بە ئیمامی علی ئەفەرموێ: «لاَ تَنْظُرْ إِلَى فَخِذِ حَيٍّ وَلاَ مَيِّتٍ، فَإِنّ الفَخِذَ عَوْرَة»، تەماشای ڕانی نە زیندو بکە و نە مردو بکە، چونکە ڕان عەورەتە.

جا ئەو یاریزانانە هەموویان ڕانیان بە دەرەوەیە هەندێکیان نەبێت.

کەواتە ئەبێ ووریابین عەزیزەکان.

ئەوە کاس عالەم دەست پێدەکات، ڕەحمەتی خواتان لێبێت دنیا چەند ڕۆژێکە و دەڕوا، چەندین کاس عالەمان تێپەڕاند، ئەمیش وەکو ئەوانی پێشوو دێت و دەڕوات، هەر ئەوکەسە زەرەر دەکات کە بە خراپی هەڵسوکەوت بکات، هەر ئەوکەسە زەرەر دەکات کارێك بکات کە خوا پێی ناڕازییە.

داواکارم لە خوا بە فەزڵ و کەرەمی خۆی ئیسلاحی حاڵمان بکات، بمان گەڕێنێتەوە سەر ڕاستە شەقامی ئیسلامەتی، ئەو ڕاستە شەقامەی کە خۆی پێی ڕازییە، داواکارم لە خوا بە فەزڵ و کەرەمی خۆی شیفای نەخۆشەکانمان بدا، ڕەحم بە ئافرەتەکانمان بکات، هیدایەتی گەنجەکانمان بدات، هیدایەتی پیرەکانمان بدات، هیدایەتی هەموولایەکمان بدات. أقول قولي هذا وأستغفر الله لي ولكم...

## وتاری دووەم

الحمد لله ثم الحمد لله لا توفيق ولا اعتصام إلا بالله، عليه توكلت وإليه أنيب.

خۆشەویستەکان بە ڕاستی زەرەر و زیانەکانی تۆپی پێ گەیشتۆتە ڕادەیەك کە بۆتەهۆی لێکەوتنەوەی کوشتار و بریندارگەلێکی زۆر زۆر، لێرەدا ژمارەی کوژراو وبریندارەکانی نزیکەی دە یاریەك دەخەمە بەردەستتان کە لە دەرئەنجامی یاری تۆپی پێوە کەوتونەتەوە.

## قوربانیەکانی تۆپی پێ

لەوانەی کە من بەرچاوم کەوتووە:

- لە دەرەنجامی یاریەك: «٤٨» دەکوژرێت و «٦٠٠» کەس بریندار دەبێت.
- لە یارییەکی تردا «١٥» کوژارو «٤٢» بریندار.
- لە یارییەکی تردا « ١٨ » کوژراو «١٠٠» بریندار. تەنها بەهۆی ئەوەی کە یەکێك لە یاریزانەکان طرد کراوە ولەیاریگا کراوەتە دەرەوە، بەهۆی ئەوەوە تەماشاکەران شەڕ و ئاژاوەکیان ناوەتەوە ئەنجامەکەی ئەو هەموو کوژراو و بریندارە بووە.
- هەروەها لە یاریەکی نێوان پیرۆ و ئەرجەنتین «٣٢٠» کەس دەکوژرێت و «١٠٠٠» کەس بریندار دەبێت. ئەمەش تەنها لەبەر ئەوەی ناوبژیوانەکە گۆڵێکی کردووە بە گۆڵ، تەماشاکەران کردوویانە بە قاڵە قاڵ و وتویانە: نەخێر، گۆڵ نی یە. بە هۆی ئەمەشەوە ئەو هەموو کوشتار و بریندارە دەکەوێتەوە.
- هەروەها لە ئەنجامی یارییەك لە کۆڵۆمبیا ئەنجامدراوە، ئەبێتە هۆی کوژرانی «٢٤» کەس و بریندار بوونی «٢١٠» کەسی تر.
- هەروەها یارییەکی نێوان لێڤەر پولی ئینگلیزی و یوڤانتوسی ئیتالی ئەبێتە هۆی کوژرانی «٣٩» کەس وبریندار بوونی «٦٠٠»کەسی تر.
- یارییەکی تر ئەبێتە هۆی کوژرانی «١٢٠» کە.
- یارییەکی تر ئەبێتە هۆی کوژرانی «٤٨» کەس وبریندار بوونی نزیکەی «٤٨» کەسی تر.
- یارییەکی تر ئەبێتە هۆی کوژرانی «٢٤» کەس و بریندار بوونی «٢٧» کەسی تر.
- یارییەکی تر «٣٧» کوژرا و«٥٠٠» برینداری لێدەکەوێتەوە.
- یارییەکی تر ئەبێتە هۆی کوژرانی «٦٦» کەس.
- یارییەکی تر ئەبێتە هۆی کوژرانی «٨٠» کەس و بریندار بوونی «١٥٠» کەسی تر.

- یارییەکی تر کوژرانی «٢٧» کەس، وبریندار بوونی «٥٢» کەسی لێدەکەوێتەوە.
- یارییەکی تر کوژرانی «٥٣» کەس، وبریندار بوونی «٢٠٠» کەسی لێدەکەوێتەوە.
- یارییەکی تر کوژرانی «٧٢» کەس، وبریندار بوونی «٢٧» کەسی لێدەکەوێتەوە.
- یارییەکی تر کوژرانی «٤٣» کەس، وبریندار بوونی «١٦٠» کەسی لێدەکەوێتەوە.
- لە یارییەکی تردا کوژرانی «٩٥» کەس، وبرینداربوونی «٢٠٠» کەسی تر.
- لە یارییەکی تردا «٤٢» کەس ئەکوژرێ، و«٤٠٠» کەس بریندار ئەبێ.

ئەمە ئەوەندەی من بەرچاوم کەوتووە، بۆ ئەوەی لە ووتارەکەمدا مشتێك لە خەرمانێك عەرزی خزمەتتان بکەم، ئەگەر بمویستایە هەموو ووتارەکەم ئەکرد بە خشتەی کوژرا وبریندارەکانی تۆپی پێ، یان بە شێوزاێکی تر بڵێم: قوربانیەکانی تۆپی پێ.

هەر بۆیە ئەمانە هەمووی هۆکارن بۆ ئەوەی باسی زەرەر و زیانەکانی تۆپێن بکرێ.

## زەرەر و زیانەکانی تۆپان

## سەر دەکێشێ بۆ خێزان

خۆشەویستەکان ململانێکە هەر لەنێوان یاریزانەکاندا نییە.

بەڵکو -وەك تەماشاتان کرد- تەماشاکەرانیشی گرتۆتەوە.

هەر لە تەماشاکەران نیە، تەنانەت هاتۆتە نێوماڵەکانیشەوە، نێوان ژن وپیاو تێك دەدات، خێزان دەشێوێنێ، شیرازەی خانەوادە تێك دەدات.

نێوان برادەر وهاوڕێ ودۆست تێك دەدات.

ئەرێ گەنجەکان چەنێکتان لەسەر تۆپێن لەیەکتر عاجز بوون؟

چەنێکتان داتان لەیەکتر؟ چەنێکتان یەکتریتان زامدارکرد لەسەر تۆپێن؟!

بە ڕاستی ئەوانەی کە تەماشای تۆپێن ئەکەن ئەگەر شارەزاییەکی شەرعییان هەبێ ئەم بابەتانەیان لا مەعلومە، ئیتر یان ئەوەیە دانەنیشتون بیری لێبکەنەوە، یان لەبیری خۆیانی دەبەنەوە.

## زەرەر و زیانەکانی تۆپان سەر دەکێشی بۆ پەیوەندی وڵاتان

خۆشەویستەکان..

تەنانەت کارەکە هەر لەوە نەماوە ئێستا وولاتانیشی گرتۆتەوە، لە یاری نێوان دوو وولاتدا کاتێك کە بابەتێکی خیلافی دروست ئەبێ هەردوو وولاتەکە عاجز ئەبن لە یەکتر.

هەر لەم ماوەیەدا بوو پەیوەندی نێوان مصر و جەزائیر وەخت بوو بگاتە شەڕی سارد، هیچی نەمابوو شەڕ لە نێوانیاندا دروست بێت.

یاریەکیان لە نێواندا بوو، ئەوەبوو یاریەکەیان نە لە مصر نە لە جەزائیر ئەنجام نەدا، بۆ ئەنجامدانی یارییەکە ڕۆیشتن بۆ سودان.

لە ٢٠٠٣ بەحرەین وسعودیە خەریك بوو شەڕی گەورە لە نێوانیاندا دروست بێت، تەنها لەبەرخاتری تۆپێن.

لە سالانی هەشتاکاندا لە یاری نێوان هندۆراس و سلفادۆر دا، نزیکەی «٢٠٠٠» کوژراوی لێکەوتەوە، شەڕی هەردوو وولات دەستی پێکرد.

بە ڕاستی مەترسییەکانی تۆپێن زۆر پەلی کێشاوە.

یەکێکی تر لە زیانەکانی تۆپی پێ —کە من نزیکەی نۆ دە زیانێکم دانابوو عەرزی خزمەتتانی بکەم، بەڵام کاتەکە بوار نادا، هەر بۆیە ئاخر زیان- بریتی یە لە:

<u>زیانی چوارەم</u>: جێهێشتنی جومعە و جەماعەت لە بەرخاتری تۆپێن.

برا بەڕێزەکانم ئەگەر موتابەعەی تۆپێن ئەکەی بەو زەوابتە شەرعیانەی عەرزم کردی موتابەعە بکە، بەڵام نوێژەکانت مەفەوتێنە.

کە بانگی فەرموو، فەرمو وەرە بۆ مزگەوت، ئەگەر ماڵت نزیك بێت ئەوپەڕی حەوت دەقە ئەبات، نوێژەکەت بکە و بڕۆرەوە تەماشای یاری خۆت بکە.

پێغەمبەری خوا -صلى الله عليه واله وسلم- ئەفەرموێ: «مَنْ تَرَكَ الْجُمُعَةَ ثَلاثَ مَرَّاتٍ مِنْ غَيْرِ عُذْرٍ طَبَعَ اللهُ عَلَى قَلْبِهِ [وفي رواية وكيع: فَهُوَ مُنَافِقٌ]».

«هەرکەسێك سێ جومعە بەبێ عوزر نەیەت بۆ مزگەوت خوای تعالی خەتم ئەدات بەسەر دڵیا، ئەبێت بە مونافیق».

ئیبن عەباس ئەفەرموێ: « هەرکەسێك سێ جومعە لەسەر یەك نەیەت بۆ مزگەوت، ئەوا ئیسلامی خستۆتە پشتی سەری و هیچ حسابێکی بۆ ئیسلام نەکردووە».

ئەبێ ووریا بین خۆشەویستەکان.

## کەسێك نەهات بۆ جومعە چی بکات؟

پێغەمبەری خوا -صلى الله عليه واله وسلم- ئەفەرموێ: ﴿مَنْ تَرَكَ الجُمُعَةَ مِنْ غَيْرِ عُذْرٍ فَلْيَتَصَدَّقْ بِدِينَارٍ فَإِنْ لَمْ يَجِدْ فَبِنِصْفِ دِينَارٍ﴾[1].

« هەرکەسێك بە ئەنقەست نەهات بۆ جومعە: با دینارێك بکاتە خێر، ئەگەر دینارێکیشی نەبوو با نیو دینار بکاتە خێر».

لە سەردەمی خۆیدا دینارێك یەك مسقاڵ ئاڵتونی عەیار «٢٤» بووە. ئێستا یەك مسقاڵ ئاڵتونی عەیار «٢٤» نزیکەی «٢٠٠»هەزار دینارە.

یەك جومعەت بە ئەنقەست لە دەست بچێت ئەبێ «٢٠٠»هەزار دینار بکەیتە خێر، ئەگەر نەشتبوو ئەبێ «١٠٠» هەزار دینار بکەیتە خێر.

ئەوە باسی نوێژە جەماعەتەکان هەر ناکەم، چونکە زۆربەی زۆرمان کەمتەرخەمین تیایدا.

بە تایبەتتر لەکاتی یارییەکانی مۆندیالدا هەر نابێت باسی لێوە بکەی و لە بەرنامەی هەندێ کەسدا هەر نەماوە.

جا سبحان الله ئەم مۆندیالە ئەوەندە غەرە کەوتۆتە کاتی تاقیکردنەوەی کۆتای ساڵی خوێندکارانەوە، زۆرێك لە خوێندکارانی مەشغوڵ کردووە، هەموتان منالتان هەیە وکەستان هەیە وباش دەزانن، ئێستا وەك ئەوسا باش سەعی ناکەن وهەوڵ نادەن و تێ ناکۆشن.

لە کۆتاییدا داواکارم لە خوای مەزن ئیصلاحی حاڵمان بکات، بمانگێڕێتەو سەر ئەو ڕاستە شەقامەی خۆی پێی ڕازیە، داواکارم لە خوای گەورە هیدایەتی دڵمان بدات، داواکارم لە خوای گەورە بە فەزڵ و کەرەمی خۆی هیدایەتی گەنجەکانمان بدات، شیفای نەخۆشەکانمان بدات، لە تاوانی دایك و باوکمان خۆش بێت، بیبوەیان بکات لە هەرچی دەرد و شەڕ و بەڵایەك، لە تاوانی مردووەکانمان خۆش بێت.

اللهم آمين، قوموا إلى الصلاة يرحمكم الله.



---

[1] حسنه بشواهده الشيخ مشهور حسن في: «كرة القدم بين المصالح والمفاسد». وضعفه الألباني وشعيب الأرناؤوط